# پەپوولە

١٧٥

www.ksc-kcf.org
www.khak.org
pepule1992@yahoo.com
pepule1992@hotmail.com



گۆڤارێکی رۆشنبیری پەروەردەیی منداڵانە، منداڵپارێزی کوردستان لە سلێمانی دەریدەکات. ژمارە(١٧٥) -٢١ی ئایاری ٢٠١٢/ ژمارە (١)ی پەپوولە لە بەهاری ١٩٩٢دا دەرچووە.



منداڵپارێزی کوردستان
Kurdistan Save the Children Children's Fund

# چرپەی داپیرە



دوا رۆژی تاقیکردنەوەکان بوو. باوان و کاڵێ لە قوتابخانە گەڕابوونەوەو لە بەردەرگە دانیشتبوون. لە ژوورەوە گوێم لە دەنگیان بوو، باس هەر باسی پرسیارەکان بوو. بەوەدا کە دڵیان خۆش بوو، دیاربوو زۆر باش بوون. منیش لە خۆشیدا بە پەلە چوومە دەرەوە تا دەستخۆشیی و ئافەرینیان لێ بکەم، بەڵام کە چومە دەرەوەو چاوم پێیان کەوت زۆر سارد بوومەوە. ئەوان چەند ناشرین بوون، ئەو ناوەیان پڕکردبوو لە توێکی گوڵەبەڕۆژەو کاغەزی بسکیت. من نەمدەویست لەو کاتەدا دڵیان بشکێنم، نەشمدەویست بە ئاسانی ئەو هەڵەیەیان بەسەردا تێپەڕێت. بۆیە دوای ئەوەی دەستخۆشیم لێکردن، بە نەرمیی پێم وتن: بە تەنها زیرەکی و نمرەی بەرز بەس نین، پێویستە خاکەکەتان ئەوەندە خۆش بوێت کە دڵتان نەیەت پیسی بکەن. باوان وتی: داپیرە، هەمووی هی من نییە، من تەنها ئەوەی خۆم پاک ئەکەمەوە.

کاڵێش وتی: منیش هەر ئەوەی خۆم پاک ئەکەمەوە. بەم وەڵامە دڵم زۆر تەنگ بوو. چومە ژوورەوە گسکەکەم هەڵگرت و وتم: قەیناکە، من پاکی ئەکەمەوە! باوان و کاڵێ بەشەرمەوە دوام کەوتن بۆ ژوورەوە. کاڵێ گسکەکەی لێسەندم و وتی: تۆ دانیشە داپیرە، هەر ئێستە من بەشەکی خۆم پاک ئەکەمەوە. با باوانیش بەشەکەی خۆی پاک بکاتەوە. لە کاتێکدا ئەوان مقۆمقۆی ئەوەیان بوون هەر یەکەیان چەندی پاک بکاتەوە، گوێم لە خشەخشێک بوو. کە چومە دەرەوە، نمنمم بینی. ئەو چەند جوان بوو. تازە لە قوتابخانە گەڕابووەوە، پارچە کارتۆنێکی پێ بوو، لەسەرخۆو بە هێمنی شوێنەکەی پاک ئەکردەوە.

سەرنووسەر

پەپوولە: گۆڤارێکی رۆشنبیریی، پەروەردەیی منداڵانە. خاوەن ئیمتیاز: هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد. سەرنووسەر: یاسین قادر زرگوێزی. دەستەی نووسەران: نەریمان عوسمان. هونەریی: غەمگین فەتاح. دیزاین: سەرخێل شێخ مەهدی. پەپوولە مانگی جارێک لە سلێمانی لەلایەن منداڵپارێزی کوردستانەوە بە تیراژی ( پێنج هەزار ) دانە بلاودەکرێتەوە و چاپکردنی لە چاپخانەی (کەکۆن)ە. بۆ کرین و بەشداریی: کۆمپانیای نێوەند ( ٠٧٧٠١٥١٧٥٣٣ )
ناونیشان: کوردستان- سلێمانی- منداڵپارێزی کوردستان.تەلەفۆن ( ٣٣٠١٠٤٢)،( ٣٣٠١٠٤٣)،( ٣٣٠٠٨٦٠)،( ٣٣٠١٠٤٦)،( ٠٧٧٠١٥٢٢٧١٨)
لە بەرواری( ٢٠١٠/١/٢٨ )دا ژمارە متمانەی ( ٣٢ ) ی لە سەندیکای رۆژنامە نووسانی کوردستان وەرگرتووە.

PAPOOLA: MONTHLY CULTURAL& EDUCATIONAL CHILD MAGAZINE. ISSUED BY: KURDISTAN SAVE THE CHILDREN.
NO.175 - May.2012, Internet: www.khak.org & www.ksc-kcf.org - E-mail: pepule1992@yahoo.com.

# هۆنراوە

وێنە: ئیسماعیل عومەر حەسەن



## بەهارە

بەهارە
چەپکە گوڵی گوڵزارە
مژدەی ژیانی تازە
چریکەو تەواو ئاوازە
بووژانەوەی ژینگەیە
گەشترین هەوار گەیە
سەرچاوەی کامەرانی
بە کوڵ رووی لە روو گەیە
بە خۆشی و شادمانی
وەرزی گەشت و سەیرانە
بانگەوازی ئاسمانە
توانامان پێئەبەخشێ
وەکو جوانترین تابلۆ
ئایندەمان ئەنەخشێ

عوسمان محەمەد هەورامی



## سمۆرە

دەنگی خرمەی ددانی
سمۆرەو بێچوەکانی
بەئاگایان هێناوم
بۆیە سەرسام وەستاوم
چاوم لێیە لەو شوێنە
وردیلانەو بێوێنە
واخۆیان رادەهێنن
خەریکی بازبازێنن
ئای خۆ وا بۆ ئێرە دێن
ریزیان گرتووە، لەسەر رێن
ئێستا دەچمە پەناوە
با نەمبینن لەم ناوە
تا دەگەنە ئاستی من
سمۆرەی سرک و شەرمن
ئەوسا گوێز دەبەم بۆیان
دەمکەن بە هاورێی خۆیان

ئەمین محەمەد



## پاداش

دایە و بابە و مامۆستا
لە زۆر کاری پێویستا
رێ ئاسان ئەکەن بۆمان
هەستین بە کاری خۆمان
بۆ بەرهەم و کاری باش
پێشکەشمان ئەکەن پاداش
تاکو زیاتر تێکۆشین
بەری رەنجمان بنۆشین
ئەو سوپاس و پاداشە
سوودو چاکەی لە پاشە
هانمان ئەدەن چالاکبین
چاو نەترس و بێباکبین
پشت بەخۆمان ببەستین
بەلاوازی نەوەستین
تا بەخۆمان بڕواکەین
مافە کانمان داواکەین

# لە پۆلێکدا



ە پۆلدا بە هێمنی دانیشتبوون. وانەکەیان زۆر بەلاوە
خۆش بوو، چونکە وانەی هونەر بوو. مامۆستا
نەریمان ) یشیان زۆر خۆشدەویست، چونکە
ەگەڵ ئەوەی کە رووخۆش بوو، هەموو
وتابییەکانیشی وەک یەک تەماشا دەکردو گوێی
ێ دەگرتن و خۆشی دەویستن. مامۆستا نەریمان
ە روخساریدا بارانی سۆزو لە ناخیدا هێمنیی و
ە وشەکانیدا زانیاریی دەباری. دوای باسکردنی
چەند بەندێک لە مافەکانی منداڵان، مامۆستا
ەریمان وتی: **کێ پرسیاری هەیە؟** هەڵسوکەوتی
امۆستا نەریمان لە گەڵ قوتابییەکاندا
هاورێیانە بوو، بۆیە قوتابییەکان چی لە
اخیاندا بوایە دەیانپرسی. پرسیارەکانیش هەریەکەو لە بارەیەکەوە بوو.

ساقیا پرسی: مامۆستا، بۆچی دوکانەکەی کۆڵانی ئێمە، لەگەڵ ئەوەی چبسەکانی ئێکس پایەربوون، کەچی هەر دەیان فرۆشێت؟ ڕەوا پرسی: مامۆستا، کاتێک دایکم جل دەشوات و هەڵیدەخات کە وشک دەبێتەوە ئاوەکەی بۆ کوێ دەچێت؟ هیواش پرسی: بۆچی دییەو سازگۆ لە خوێندنەوەدا خێراو باشن، کەچی ئێمە وانین؟

لە کاتێکدا هەمووان چاوەروانی وەڵام بوون، زەنگی پشوو لێیدا. ئیتر قوتابییەکان تێکەڵاوی یەکتر بوون و چوونە گۆرەپانی قوتابخانە. هەر دەنگە دەنگیان بوو لەوە دەچوو هەر خۆیان وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە.



عەلی حەمە رەشید بەرزنجی

# خاوداران

# نیکۆلای نۆسۆڤ



چیرۆک نووسی منداڵان و دەرهێنەری سینەمایی نیکۆلای نۆسۆڤ لە ساڵی ( ١٩٠٨ ) دا لە شاری ( کیف ) ی ئۆکرانیا لە خێزانێکی هەژار لەدایکبووە. بە هۆی کەمدەرامەتی خێزانەکەیەوە نەیتوانیوە درێژە بەخوێندن بدات و لەتەمەنی چواردە ساڵیدا واز لە خوێندن دەهێنێت و دەست دەداتە کارکردن، بەڵام بێهیوا نابێت و شانبەشانی کارەکەی کۆشش دەکات تا لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا بەشداریی تاقیکردنەوەکان دەکات و دەردەچێت. پاشان پەیمانگەی سینەما لە شاری مۆسکۆ تەواودەکات و لە ساڵی ( ١٩٣٢ ) دا دەبێتە دەرهێنەری سینەمایی. ماوەی بیست ساڵ کاری دەرهێنان بۆ چەندین فیلم کارتۆنی زانستی و پەروەردەیی دەکات. دواتر واز لە کاری دەرهێنەریی دەهێنێت. لە ساڵی ( ١٩٤٥ ) دا یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی منداڵان بڵاودەکاتەوە. لە ماوەی ژیانیدا چەندین چیرۆکی بۆ گشت ئاستەکانی منداڵان نووسیوەو زۆرێکیان وەرگێڕاونەتە سەر زمانەکانی تر، لەوانە زمانی کوردی. ساڵی ( ١٩٧٢ ) لە شاری مۆسکۆی پایتەختی روسیا کۆچیدوایی دەکات.

## زۆپای دار

ئامێرێکی گەرمکەرەوەی ناوماڵەو بە زۆری لە گوندەکاندا بەکاردەهێنرێت. تەنەکەچییەکان لە تەنەکەو چینکۆ دروستی دەکەن و شێوەکەی لوولەییە. دوو دەرگەی لەسەریەکی هەیە، گەورەیەک و بچوکێک. گەورەکەیان بۆ تێکردنی ( دار )ەو پاش گردانی دارەکە، دەرگەکە دادەخرێت، بەڵام بچوکەکەیان هەوا ( ئۆکسجین ) ی لێوە دەچێتە ژوورەوەو هەر کاتێکیش دابخرێت، ئاگرەکە خەفە دەبێت. بەشی سەرەوەی زۆپاکە لوولەیەکی پێوەیە کە دووکەڵی لێوە دەچێتە دەرەوەو پێی دەڵێن دووکەڵکێش. جاران ئەم زۆپایە زۆر بەکاردەهێنرا، بەڵام ئێستا کەم بۆتەوە.




## پێڵاوی جاش کەوش

کاتی خۆی لە کوردستاندا لە گەرمەی جەنگی جیهانی دووەمداو بەهۆی گرانی و نەبوونی کەرەسەی دروستکردنی پێڵاوەوە، ئەم جۆرە پێڵاوە دروستکراوە. ئەم پێڵاوە زۆر توندو تۆڵ بووەو دوای ئەوەی ئۆتۆمبێل لە کوردستاندا زۆربووە، ژێرەکەی ( بنەکەی ) لە لاستیکی تایەی ئۆتۆمبێل دروستکراوەو سەرەوەشی ( چەرمی گا ) ی تێگیراوە. بە زۆری گوندنشینەکان بەکاریانهێناوەو زۆر لەباربووە بۆ دەشت و گردو شاخەکان.



ئا: دیاری

وێنە: سامان عوسمان

# بێچووە ئاسکێک
# اشا بەئاگا دێنێتەوە



شێری پاشای دارستان ماوەیەک توشی خەمۆکیی دەبێ. وای بە باش دەزانێ بە نێو دارستاندا بگەڕێ و لە نزیکەوە ئاژەڵانی هاورێی ببینێ، بەڵکو کەمێ باری دەروونیی چاکبێتەوە. بەڵام دوای کەمێک گەڕان، هەستدەکات خەمۆکییەکەی زیاتر دەبێ، چونکە ئەوەی پاشا لێی بەنیاز دەبێت وانابێت. لەو دارستانە نەدەچوو کە بەسەروباڵایدا هەڵیاندابوو.



ڕۆژی دواتر پاشا گیانداران کۆدەکاتەوە تا باس لە کەمو کورتیەکان بکەن. بەچکە ئاسک بە یاریکردنەوە دەچێتە بەردەمی پاشاو دەڵێ: گەورەم، بەرەبەیانێک دایک و باوکم ویستیان بۆ پەیداکردنی خۆراک بچنە دەرەوە، من دەستم بەگریان کرد. دایکم وتی: بۆچی دەگریت؟! وتم: بە تەنها دڵم زۆر تەنگ دەبێ، نازانم تا ئێوە دێنەوە خۆم بە چییەوە سەرقاڵ بکەم. دایکم وێنەیەکی جوانی بۆ کێشام و باوکیشم هۆنراوەیەکی خۆشی لە دامێنی وێنەکەدا نوسی. ئەو ڕۆژەم هێندە بەلاوە خۆشبوو هەر نەمزانی چۆن تەواوبوو.





بەچکە ئاسک کەمێک دەوەستێ، پاشان دەڵێ: گەورەم، بۆ ڕۆژی دوایی کە ویستیان بچنە دەرەوە، داوای وێنەیەی نوێ و هۆنراوەی نوێم لێکردن. بەڵام ئەمجارە وتیان " لێمان ببورە، هەموو کات ناتوانین بەو کارە هەستین، چونکە کە دێینەوە ماندوین و دەنوین، بە ڕۆژیش بەس فریای بژێوی دەکەوین". بەچکە ئاسک ئەمەی وت و گەڕایەوە لای دایکی.



پاشا وتی: کەس لەم بەچکە ئاسکە حاڵی بوو؟! یەکێ لە نزیکانی پاشا وتی: گەورەم، ئەوەی من تێیگەیشتم، ئەوەیە هەر داهێنانێک یا هەر بیرکردنەوەیەک لە نوێکاریی و پێشکەوتن، پێویستی بەکات هەیە، بەڵام لەم دارستانەدا داهێنەران سەر قاڵی بژێوین، گەر هاوکاریی نەکرێن ناتوانن بیر لە شتی نوێ بکەنەوە.



پاشا کە بۆی دەرکەوت کەسانی داهێنەر پشت گوێ خراون، وتی: لەمرۆ بە دواوە رێزو هاوکاریم هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە لە هەر بوارێکدا بێت داهێنان دەکەن و دارستانەکە پێشدەخەن. هەموو بەخۆشحاڵیەوە سوپاسی پاشایان کرد. ئیتر لەو رۆژە بەدواوە باری گوزەرانی خەڵک باشترو دارستانیش خۆشتربوو.



کە پاشا ئەمەی بە چاوی خۆی بینی، وتی: بەراستی هەر کۆمەڵگەیەک داهێنانی تێدا نەبێت خۆشەویستیشی تێدا بەدی ناکرێت. خۆزگە رۆژێ زووتر بەئاگامتان دەهێنایەوە، چونکە بۆم دەرکەوت داهێنان و کارکردن چاری خەمۆکیش دەکەن.

جەلیل حەمە سەعید رەشید
وێنە: سەرتیپ فەتاح





کێک


خۆلڕێژ


چادر


شفتە


پەنیر


ئاگر


پەرداخ


ماسی

لە تابلۆکەدا
ئەم وێنانە
بدۆزەرەوە.

# باڵندەی تەنور

باڵندەیەکی ڕەنگینی دەنگخۆشی کۆچەرییە. نیشتمانی سەرەکی ئەمەریکای باشورەو بە زۆری لە ناو دارستانەکان و شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤدا دەژی. هێلانەکەی لەسەر چڵی دار یان لە بنمیچی ماڵاندا لە قوڕو گژوگیا بەشێوەیەکی سەرنجراکێش لە شێوەی ( تەنوری نان ) دا دروستدەکات، هەربۆیە پێی دەوترێ باڵندەی تەنور. درێژییەکەی ( ١٥-٢٠ ) سانتیمەتر دەبێت. نێرەو مێیەی لە شێوەو ڕەنگدا وەک یەکن. ڕەنگی پەڕەکانی پشتی و باڵەکانی زەیتونی و



قاوەین، ڕەنگی سنگی سپیەو هێڵی ڕەشی تێدایە. چاوەکانی خڕن و بەدەوریدا هێڵێکی سپی هەیەو هێڵێکی ڕەشیش بە ژێر چەناگەیدا شۆڕبۆتەوە. پۆپنەیەکی بچوکی پرتەقاڵی هەیەو دەنووک و قاچەکانی ڕەنگیان پەمەییە. خۆراکی سەرەکی کرم، مێشومەگەزو میوەیە. مێیەکان ( ٣-٥ ) هێلکە دەکەن کە ڕەنگیان سپییەو پەڵەی قاوەییان تێدایە. بە هۆی گەرمی هێلانەکەیانەوە کە بە پووش و گژوگیا ناوپۆشکراوە، هێلکەکان لە ماوەی ( ٢٠ ) ڕۆژدا دەتروکێن. بێچوەکان لە تەمەنی ( ١٨ ) ڕۆژیدا پەڕ دەردەکەن و تا تەمەنی ( ٣ ) مانگی لە ژێر چاودێریی دایک و باوکیاندا دەمێننەوە.

ئا: دیلان

وێنە: سامان عوسمان

# من هەستی کەسانی تر رادەگرم



هەموو بەیانیەک چاوەڕێی زەنگی قوتابخانەم لێ بدرێ. هەموو لە ریزدا دەوەستین. ڕێ بە هاوڕێکەم دەدەم لە پێشمەوە بوەستێ و لەسەر ئەوە دڵی ئازارنادەم. بەیانییەک قوتابییەکم بینی لەسەر کورسی یاریگەکە بە تەنیا دانیشتبوو. هەستم بە تەنیایی ئەو کردو داوام لێکرد تا یاریم لە گەڵدا بکات. بە خۆشحاڵیەوە پەسەندی کردو پێکەوە یاریمانکرد. دواجار بوینە دوو هاوڕێی خۆشەویستی یەکتری.



قوتابییەکی پۆلی یەکم بینی ئەگریا. هۆی گریانەکەیم پرسی، پێی وتم کە پارەی ڕۆژانەکەی ونکردووە. خێرا کەوتمە گەڕان تا بۆم دۆزییەوە. زۆر دڵی خۆشبوو. چوو شیرینی پێ کڕی و وەک سوپاسێک هەندێ شیرینیشی پێشکەشکردم. ئای چەند نیگەران دەبم کاتێک دەبینم کەسێک خەمبارە، چەند دڵخۆشیش دەبم کە دەبینم کەسێک دەم بە خەندەیە.



نەمزانی، پێنووسی هاوڕێکەمم شکاند. داوای لێبوردنم لێکردو پەیمانم پێدا کە بەیانی پێنووسێکی نوێی بۆ ببەمەوە. بۆ بەیانی پێنوسێکی نوێم بۆ بردو ئەویش لێم بورا. ئای چەندم پێ ناخۆشە کە دەبینم کەسێک لێم نیگەرانەو چەند خۆشحاڵیش دەبم کاتێ لێم دەبورێ.



پشیلەیەکم بینی سەری لێ شێوابوو، برسی و بێهێزبوو.
لێی نزیک بومەوەو خواردنم دایە. ئای چەند خۆشحاڵ دەبم
کاتێک خۆراک دەدەمە ئاژەڵێک.



ژنێکم بینی لەسەر کورسیەکی جوڵاو دانیشتبوو.
رامکردو لە سەرکەوتن بەسەر شۆستەکەدا یارمەتیم دا.
پڕ بە دڵ سوپاسی کردم و وتی تۆ زۆر میهرەبانی.
ئای چەند دڵخۆشبووم کە یارمەتیی ئەو ژنەم دا.



هاورێکەم بە هۆی نەخۆشیەوە نەیتوانی بێتەوە بۆ قوتابخانە. هەر کە گەڕامەوە،
تەلەفۆنم بۆکرد تا ئەو وانانەی بۆ شیبکەمەوە کە ئامادەیان
نەبوو. بۆ رۆژی دوایی سەردانم کردو دیارییەکی
سادەشم بۆ برد. بیرم چوو پێتان بڵێم، من یاری
بە تۆپ زۆر دەکەم، بەڵام کەس بێزار ناکەم، چونکە
زۆرم پێناخۆشە کاتێک دەبمە هۆی بێزارکردنی
کەسانی-تر.

لە عەرەبییەوە : سروە مەحمود
وێنە: سەرتیپ فەتاح

# شاری یاری

وێنە: سەرتیب فەتاح





چەند سێگۆشە لە
خشتەکەدا دەبینیت ؟





جیاوازییەکانی نێوان ئەم دوو وێنەیە بدۆزەرەوە



تەنها یەکێک
لەم سێبەرانە
ڕاستە، کامیانە ؟

كام لەم ئاسكانە
لەوانیتر جیاوازە ؟





هەر وێنەیەک بگەیەنە
بەو وێنەیەی لە گەڵیدا
دەگونجێت .



ئەم تابلۆیە
ڕەنگ بکە

# نیشتمانەکەمان بناسین

## شاری عامودا ( ئامودا )



عامودا یەکێکە لە شارە دڵگیرەکانی رۆژئاوای کوردستان و سەر بە پارێزگای حەسەکەیە. لە رۆژهەڵاتەوە شاری قامشلۆو لە رۆژئاواوە شاری درباسیەو لە باشورەوە شاری حەسەکە دەوریان داوە. عامودا هەمیشە بنکەی زانست و زانیاری بووە، لەناو مزگەوتی گەورەی ئەم شارەدا قوتابخانەیەکی ئاینیی لێبووە کە زانایان لە سەرجەم ناوچەکانی کوردستانەوە روویان تێکردووەو مۆڵەتی زانستییان تێدا وەرگرتووە. هۆنەری گەورەی کورد جگەرخوێن و مەلا عەبدول لەتیف و مەلا شێخموس قرقاتی لە دەرچوانی ئەم قوتابخانەیە بوون. هەروەها زانستی پزیشکیش روویەکی گـــەشی ئەم شارە بووە کە زاناکانی ئەم شـــــارە لە باپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە. شـــارەزایان دەڵێن وشەی عامودا لە وشـــەی ( ئومێد ) وە هاتووە. ئومێد ناوی ســــەرکردەیەکی میدیەکان بووەو ناوی چەند شـــارێکی کوردستان لەم وشەیەوە ســــەرچاوەیان گرتووە. شـــاری ( ئامـەد: دیاربەکر ) لە باکوری کوردستان و ( ئامێدی کە دواتر کراوە بە عمادیە ) لە باشورو ( ئامودا کە دواتر کراوە بە عامودا ) لە رۆژئاوا، هەمان سەرچاوەیان هەیە. عامودا خاکێکی بەپیتی هـەیەو دانیشتوانەکەی کە نزیکەی ( ٥٠,٠٠٠ ) کەس دەبن، سەرقاڵی ئاژەڵداریی و کشتوکاڵن. گەنم و جۆو لۆکەی عامودا زۆر بەناوبانگن.

## کە زۆر ماندوو دەبین، توشی هەناسەبڕکێ دەبین! بۆچی؟



کاتێک کە وەرزش دەکەین یان کارێکی قورس دەکەین، هەندێ لە ئەندامەکانی لەشمان ماندوو دەبن. هەر ئەندامێکیش کە ماندوو دەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بە باشی ئەرکەکانی جێبەجێ بکات، پێویستی بە ئۆکسجینی زیاترە. ئەو ئۆکسجینەش تەنها لە رێگەی خوێنەوە دەگاتە ئەندامە ماندووەکان، بۆیە لێرەدا دڵ بۆ ئەوەی زۆترین بری خوێن ( ئۆکسجین ) بنێرێت بۆ ئەندامەکان، خێراتر دەستەکات بە لێدان، بەڵام ئەو برە ئۆکسجینەی کە لەم کاتەدا لە خوێندایە بەشی هەموو ئەندامە ماندووەکان ناکات. واتە خوێنیش دەبێت ئۆکسجینی زیاتر پەیدا بکات. ئۆکسجینیش تەنها لە سییەکانەوە دەگاتە خوێن. بۆیە لەم کاتەدا سیەکانیش بۆ ئەوەی بتوانن زۆرترین بری ئۆکسجین لە هەواوە هەڵبمژن و بیکەنە ناو خوێنەوە، دەکەونە پەلەپەل، واتە هەناسەبرکێ دەست پێدەکات. بەم شێوەیە هەناسە برکێکە دەبێتە هۆی ئەوەی ئۆکسجینی زیاتر بچێتە ناو سییەکانەوە، سییەکانیش ئۆکسجینەکە دەکەنە خوێنەوە، خوێنیش دەینێرێ بۆ ئەندامە ماندووەکە بۆ ئەوەی لە

ئا: راشنۆ





ئا: غەمگین فەتاح



یاسوۆ ئۆتسوکا

# کۆنان
## کورەکەی دوارۆژ







**ناوی ئەنیمی:** کۆنان، کورەکەی دوارۆژ
Conan, the Boy in Future
**نوسەر :** هایۆ میازاکی
**وێنەکێش:** هایۆ میازاکی - یاسوۆ ئۆتسوکا
**میوزیک:** شینچیرۆ ئیکیبی
**دەرهێنەر:** هایۆ میازاکی
**ماوە:** ٢٦ ئەڵقە
**جۆری ئەنیمی:** ئەندێشەیی زانستی، پەروەردەیی، سەرکێشی
**ساڵی بەرهەمهێنان:** ١٩٧٨
**کۆمپانیای بەرهەمهێن:** نیپۆن ئەنیمەیشن

سەرنج: ئەم ئەنیمییە بە ( عەدنان و لینا) و (دیارو دێژین) یش ناسراوە.

### کورتەی چیرۆکەکە:

دوای کۆتایی جەنگی سێیەمی جیهانیی، (کۆنان) و باپیرەی بە تەنها لە دورگەیەکدا دەژین بە ناوی (دورگەی ونبوو). ئەوان وادەزانن لەسەر زەوی تەنها ئەمان ماون. ڕۆژێک کچێک (لانە) دەگاتە ئەو شوێنە. دواتر ئەو کچە لە لایەن کۆمەڵێکەوە دەفڕێندرێت، کۆنانیش بڕیار دەدات بچێت ڕزگاری بکات، چونکە ئەو کاتە هەستدەکات کە مرۆڤی تریش ماون.

**کۆنان**

تەمەنی ١١ ساڵە، کوڕێکی زۆر بەهێزەو بە تەنها لەگەڵ باپیریدا دەژی.



**لانە**

یەکەمین کەسە کە کۆنا[ن] دەیبینێ. پاش ڕفاندنی کۆنان ڕزگاری دەکات

**جیمسی**

کوڕێکی بێکەسە. دەبێتە هاوڕێی کۆنان.







**دکتۆر راو**



دکتۆرێکی زیرەکەو توانای بەدەستهێنانی وزەی خۆری هەیە.

**لیپکا**



کەسێکی تاوانبارەو سەرکردەی قەڵاکەیە. دەیەوێت دەسەڵاتی خۆی بەسەر جیهاندا بسەپێنێت.

**مۆنسلی**



یاریدەدەری لیپکایە. سەرەتا دژی کۆنانە، بەڵام دواتر دەبێتە هاورێیەکی نزیکی.

**دایس**



کاپتنی کەشتییەکەو لەرێگەی ئەمەوە کۆنان دەگاتە قەڵا.



کۆنان لە رێگە کەسێک بە ناوی (جیمسی) دەناسێت و پێکەوە دەچن بە ئەو قەڵایەی کە لانەی لێبەندکراوە. پاش بەربەرەکانییەکی زۆر دەتوانن لانە رزگاربکەن و پاشان بگەڕێن بەدوای باپیری لانەدا کە کەسێکی زیرەکەو دەتوانێت بۆ پێداویستییەکانی قەڵاکە، سوود لە وزەی خۆر وەربگرێت. پاش دۆزینەوەی باپیری، هەموو هاورێکان پێکەوە دەچن بۆ ( دورگەی هیوا) کە شوێنێکی ئاوەدانەو خەڵکەکەی بە خۆشی دەژین. لەوێش روبەرووی چەند کێشەیەک دەبنەوە، بەڵام بە هاوکاریی گەورەی دورگەکە کێشەکان چارەدەکەن. لەکۆتاییدا سەرجەم خەڵکەکە یەکدەگرن و گرفت و دوبەرەکی نامێنێت و پێکەوە دەگەڕێنەوە بۆ دوورگەی ونبوو.



**گەچ** **پاسکۆ** **گۆرۆس**







یاریدەدەری (کاپتن دایس)ن.

**ئۆرۆ**



لە دورگەی هیوا دەژی و دەستیکرتووە بەسەر ناوچەیەکی دورگەکەدا.

**تێرا**

خوشکی ئۆرۆیەو دەبێتە هاورێی جیمسی.

# هەمووی بخۆم تێر ناخۆم



کچە شوانە وردیلەکە، دوای نیوەڕۆ کۆمەڵێ بزن و کاری بەرەو گردۆڵکەکە برد. رانە بچکۆلەکە بە باعەباع و یاریکردن بەو ناوەدا بڵاوبوونەوە. کارە بازوو زۆر لاسارو بەرچاوتەنگ بوو. پەڵە سەوزاییەکی بچکۆلەی دییەوەو خرمەخرم دەستیکرد بە گیاخواردن. چەند کارێک چوون بۆ لای، ویستیان لەگەڵی بلەوەڕێن، کەچی کارە بازوو بە قۆچ تێیانکەوت و دووری خستنەوە.



کچە شوان چوو بۆ لای و وتی: بەسە خۆپەرستی! ئەم پەڵە گیایە بەشی هەمووتان دەکات، هاورێکانت لە خۆت مەکە! ئینجا ئەوانی تری هێنایەوە سەر پەڵە گیاکە، بەڵام هەر کە کچە شوانەکە ئەوێی جێهێشت، کارەبازوو کەوتەوە وێزەیان و پێیوتن: ئەمە بەشی خۆمەو بەس. هەموویشی بخۆم تێرناخۆم! کەواتە هەرچی زووە لاچن لێرە.



ئەوان رۆیشتن و دەستیانکرد بە گەڕان، تا کەمێک لەوەڕیان دەستبکەوێت. کارە بازووی چاوبرسیش هەر تێیدەترشاندو بەزەیی بە گەدەی خۆیدا نەدەهاتەوە. ئەوەندەی خوارد تا هەناسەی تەنگبوو، بە باشی کاوێژی بۆ نەدەکرا.



لای ئێوارە کچە شوانەکە کۆیکردنەوەو پێشی خۆی دان بەرەو ناو دێ. بەڵام کارە بازوو پێیان رانەدەگەیشت، لێیان پاڕایەوە کە بچن بە هانایەوە. کارو کارژۆڵەکان ئاوڕیان لێ نەدایەوە، وتیان: ئەو چاوچنۆکە نەیدەهێشت لە گەڵیدا بلەوەڕێین. ئەوەندەی خواردووە هێزی لەبەربڕاوە. ئەوە ئەنجامی کردەوەی نادروستی خۆیەتی. بزنەکان وتیان: با ئەو هەڵەیەکی کردبێ، نابێ ئێوەش هەڵە بکەن. پێویستە یارمەتی بدەن.



کارە بازوو هەر دەیباعاند، داوای یارمەتی دەکردو دەیوت: جێم مەهێڵن! ئیتر ڕەوشتی وەهام لێناوەشێتەوە. هەمووان چوون بە لایەوە. دایکی چارەسەرێکی سەرەتایی بۆ کرد تا نەختێ ئاسایی بووەوە، پاشان لێی پرسی: ئێستا خۆت چۆن دەبینی؟ کارە بازوو وەڵامیدایەوە: دوو هەڵەی گەورەم کرد. یەکەم هاوڕێکانم لەخۆمکرد، دووەم بە زیادەخۆریی تەندروستی خۆم تێکدا.

دەست و چاوتان خۆش

# گۆڤارێک ئاشتیکردنەوە

وێنە:ئیسماعیل عومەر حەسەن



خوشک و برایەک هەبوون ناویان ئیماو کاروان بوو. ڕۆژێک ئیماو کاروان لەسەر گۆڤارێکی منداڵان لە یەکتری زیز دەبن، هەریەکەو لە لایەکەوە گۆڤارەکە رادەکێشێ تا لە ناکاو گۆڤارەکە دەدڕێ. لەم کاتەدا باوکیان دێتەوەو گۆڤارێکی تازەی بۆ کڕیون. ئیماو کاروان بەیەکەوە رادەکەن تا گۆڤارەکە لە باوکیان وەرگرن. ئیماو کاروان ئەمجارە بەیەکەوە گۆڤارەکەیان خوێندەوە، لەیەکتر زیز نەبوون و گۆڤارەکەیان نەدڕاند.



لەنیا بەکر حەمە صاڵح
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی ئیبراهیم ئەحمەدی بنەڕەتی

**سەرنج:**
ئەم بابەتە لە چیرۆکی وێنەیی دوا لاپەڕەی ژمارە (١٦٦) ی پەپوولەوە وەرگیراوە.

# باخچەکەی هەستی



سایە فەرهاد هاشم
پۆلی شەشەم
قوتابخانەی ئەمین زەکی بنەڕەتی



هەستی باخچەکەی زۆر بەلاوە جوان بوو، بەڵام کاتێ قوتابخانە کۆتایی هات، زۆر گرنگی بە باخەکەی نەدەدا، تا ڕۆژێک بینی کە گوڵەکانی هەمووی زەردبوون و جوانیەکەی جارانیان نەماوە. بۆ بەیانی چووە قوتابخانە تا نمرەکانی وەربگرێتەوە، مامۆستا دەیزانی قوتابییەکانی گوڵیان زۆر خۆش دەوێت، پێی وتن: کێ زۆر گرنگی بە باخچەکەی دەدات؟ جگە لە هەستی، هەموویان دەستیان هەڵبڕی. مامۆستا وتی: هەستی گیان، خۆ تۆ باخچەکەت زۆر خۆشدەویست، بۆچی دەست هەڵنابڕی؟ هەستی وتی: مامۆستا، بە ڕاستی من ئێستا کاتی خۆم بە کۆمپیوتەرەوە بەسەردەبەم. هەست دەکەم چاوەکانم دێشێن. مامۆستا وتی: هیوادارم دووبارە گرنگی بە باخچەکەت بدەیتەوە. هەستی وتی: وادەکەم مامۆستا گیان. کە هەستی چووە ماڵەوەو کارتەکەی پیشانی دایکی دا، دایکی بڕیاری دا چەند نەمامێکی جوانی وەک خەڵات بۆ بکڕێ و هاوکاریی بکات تا باخچەکەی ببوژێنێتەوە.

# دەست و چاوتان خۆش



مینا میران/( ٨ ) ساڵ - سلێمانی





شنیا جەلال/( ٨ ) ساڵ- سلێمانی





سۆما ساڵح/(١١) ساڵ - سلێمانی





بەرزی ئەزمەر/ ( ٨ ) ساڵ - سلێمانی





شانیا شیروان/( ٥ ) ساڵ - سلێمانی





سیمۆ سمکۆ/( ٥ ) ساڵ - سلێمانی



